{ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ }.

سـەرەتایی هـەموو کارێک بەناوی خـودا.



# ناسنامەی کتێب.

ناوی کتێب:1+5=1؟.

ناوی نووسـەر:ئەڤین محمد.

ژمارەی پەڕە:30.

جۆری کتێب:کورتە چیرۆک، پەیامێک.

نووسین و ئامادەکردنی:

ئـەڤـیـن مـحـمـد.

- **پێشکەشە بـــە: ئەم کتێبە پێشکەش نییە بەهیچ کەسێکی دیاریکراو، بەڵکو ئامانج لەنووسینی تێگەشتنە لەبارودۆخەکان و بە نەزانینی شتەکان بڕیار لەسەر هیچ شتێک نەدەین بەتەنها زانینی کورتەیەک لەبابەتەکە بڕیار لەسەر تەواوی چیرۆکەکە نەدەین، لەکۆتایدا مرۆڤ چەند بەهێز بێت ڕەنگە وشەیەک ئازاری بدات، بیرکرنەوەیەکی هەڵەی تۆ ڕەنگە ژیانی وێران بکات و دەستبەردای ژیان و ئامانجەکانی ببێت.**

- تکــایه له پەنجەره تەڵخەکەی خۆتەوە سەیری ژیانی هیچ کەسێک مەکە، پەنجەرەکەت پاک بکەوە لە تەڵخی گومانی پیس و بیرکردنەوەی ناشیرین دواتر سەیری دیمەنەکە بــــکە، ناکرێت لەپەنجەرەیەکی ژەنگاوییەوە ژیانی کەسانی دیکە ژەنگ بکەیت.

- **بیرکــاری دەڵێت:1+5=6**

**بەڵام بــۆ لەکۆمەڵگاکەی من بینیم 1+5=1**

**بیرکاری بەیاسا سەلماندوویەتی دەکاتە6 ئەی نیشتیمان بەکۆمەڵگاکەت بڵێ چۆن دەیسەلمێنن 1+5دەکاتە1؟.**

# بەیانی باش نیشتیمان

بەیانی باش نیشتیمان

بەکات و ساتی تۆ ئێستا بەیانییە

بەڵام ژینی من لەنیوە شەو دەچێت هێندە تاریکە

فرمێسک لەچاوانم ناوەستێت وەکو مانگی چواردەی ئاسمان دڵم پــڕە.

نیشتیمان مەگەر مرۆڤ بۆ ژیانکردن لێرە نییە؟

بــۆ هەزاران هۆکاری مردن لێرە چواردەوریان داوین، هەر بەڕاست نرخی باڵەخانە بەرزەکان لەنرخی ڕوحی مرۆڤێک زیاترە؟.

نیشتیمان من توڕە و بێ ئومێدم لەتۆ، ناکرێت تاکو کۆتایی تەمەن تۆ بەو شێوەیە بمێنیتەوە.

دەزانیت من بـۆ ئێستا دەگریم و بەبێ دەنگی لەئاسمانی شارەکەم دەڕوانم؟.

دەزانیت هۆکار چییە ...؟

نا بێگومان نازانیت، باخۆم پێت بڵێم بــۆ هێندە پڕم لێت

بەهۆی ئەم کۆمەڵ... گا یەی تۆوە ڕۆژێک نییە خوێنی کیژێک نەڕێژرێت بۆ حەزێکی چەند سانییەی کیژێکی پاک دەکەنە قوربانی وەکو گورگێکی برسی لەکوچەو کۆڵانەکانی شاردا بڵاوبوونەتەوە، دەڕواننە لاشەی پاکی کیژی گەڕەک و کۆڵانەکان.

بەڕاست نیشتیمان بەشی بەیانی ئەمڕۆش جۆ و گەنمت بەشی کۆمەڵ...گا کەت دەکات.؟

بەتەمایت تاکو کەی ببیت بەپەنا بۆ ئەم کۆمەڵ...گایە؟.

بەنیازنیت حاشایان لێبکەیت؟.

ئاخر نازانیت من چیم لەدەستە...؟

پێت بڵێم لەناو دەستەکانم چی هەیە و چی تۆمارکراوە؟.

ماڵێکی تازە هاتنە گەڕەکەکەمان تەنها پیرە پیاوێکی بەتەمەن بـوو، لاوەکانی کۆڵانەکەمان هاوکاریان کرد لە داگرتنی کەلوپەلەکانی و ماڵەکەیان بۆی ڕێکخست چونکە کەلوپەلەکانی زۆر کەم بوون، ڕۆژانەش هەر جارەو دراوسێیەک قاپێک خواردنی

بۆ دەبرد یان دەچووە لای عەرەبانەی سەری کۆلانەکەو لەفەیەکی دەخوارد و تاکو ئێوارە لەچایخانەکەی گەڕەکەکە دادەنیشت، لەدڵی خۆمدا هەموو ڕۆژێک دەمگوت منداڵی ئەم سەردەمە چەند بێ سفەتن چۆن باوکیان بەخێو ناکەن؟ باوکێک بەتەنها دە ڕۆڵەی خۆی پێدەگەیەنێت بەڵام دە منداڵ ناتوانن باوکێک بەخێو بکەن، دەبوو لەجیاتی گۆچان دەستی منداڵەکانی لەناو دەستی بوونایە و ببن بەگۆچانی باوکیان لەڕۆژە سەختەکان بەڵام کوا؟ پارچە دارێک شوێنی وەفای ئەوانی گرتۆتەوە.

ڕۆژێک تەواو دڵم پڕبوو لەپێش دەرگا وەکو هەموو ئێوارەیەک دانیشتبـوو ڕۆشتمە لای و دوای گفتوگۆیەکی کورت و ئەحواڵ پرسین پرسیارم کرد.

**-مامە** بۆچی بەتەنها دەژیت، بۆچی منداڵەکانت سەردانت ناکەن ؟ببورە ڕەنگە غەمباربیت بەم پرسیارە بەڵام بەرگەم نەگرت و هاتمە لات .

**+ڕۆڵە** مادام پرسیارت کردووە دەبێت گوێگریش بێت وەڵامەکەی چەند ساڵە لەناو دڵم ماوەتەوە دڵم لەگەڵ وشەکانی ناو دڵم ڕزیوە هیچ کەسێک لێی

نەپرسیوم تاکو ناخم بەتاڵ بکەمەوە، ئاگری دڵم بڵێسەی دێت نازانم کەی خامۆش دەبێت؟.

بەبێ دەنگی لێیم دەڕوانی چاوەکانی فرمێسکی تێدا قەتیس مابوون وردە وردە دەنگی هەڵبڕی و دەستی بەقسەکردن کرد هەرچەندە لەبەر هەنسکی گریان وشەکانی بەزەحمەت دەگەشتنە گوێم بەڵام کەمێک نزیکتربوومەوەو گوێم بۆ وشە پڕ لە ئازارەکانی گرت.

- **گوتی** 6ساڵ پێش ئێستا تووشی ڕوداوی هاتووچۆ بووم و هەموو خێزانەکەم لەدەستدا تەنها کچێکم نەبێت کەبۆم مایەوە و خۆم توانای بیستنم لەدەستدا کچەکەم بووە گۆچانی دەستەکانم بووە هێزی پشت و ئەژنۆکانم، ژیانی خۆی تەرخان کرد بۆمن وازی لەخوێندن هێناو دەستی بەکارکردن کرد، کچ نەبوو فریشتە بوو وەک باڵی پەپولە ناسک بوو چاوەکانی وەک شینی ئاسمان ئارام بوون، پێکەنینەکەی سارێژی برینی دەکرد، کە لەدایک بوو ناوم لێنا گوڵ بەوهیوایەی وەکو گوڵێک بیپارێزم لەڕەشەبای کۆمەڵگا و نەهێڵم بوەرێت و دووری بخەمەوە لە خەزان، هەمیشە وەرزی

بەهار میوانی گوڵی ماڵەکەی من بێت، بەڵام
ڕۆژێک هاتەوە ئیدی ئەو پێکەنینەیم نەبینی،
برینەکانم بەبێ ساڕێژکردن مانەوە وردە وردە
ڕەنگی سور چاوەکانی داگیردەکرد چاوە شینەکەی
هەستی ئارامیان لێ تۆرابوون، گوڵە گەش و
کراوەکەم نزیک بوو لەوەرزی خەزان، ڕۆژانە
لەناو حەوشە دادەنیشت بەبێ دەنگی لەئاسمانی
دەڕوانی وەک بڵێیت شتانێک بۆ خودا باسدەکات
من گوێم لەهەنسک و گریانی نەبووە بەهۆی
نابیستێکەمەوە بەڵام لەپەنجەرەی هۆڵەکەوە سەیرم
دەکرد گەڵای دارەکان دەوەرین دیارە وەرزی
پایزە، تاڵی پرچەکانی هاتووچۆیان دەکرد وادیارە
دەرەوە کزە بایەکی دێت، زوو زوو دەست بۆ
ڕوومەتی دەبات دیارە فرمێسک لەچاوانی
دەبارێت، گوێم لەهیچ شتێک نییە بەڵام چاوەکانم
پێناسەیەکی بەوشێوەیان بۆ کردم، گوڵی ژیانم
هەڵوەری دوای چەند مانگێگ بەیانییەکەی چوومە
ژوورەکەی تاکو بەئاگای بهێنمەوە بچێتە
سەرکارەکەی بەڵام چیم بینی؟لاشەی نوقمی خوێن
بووبوو کۆتایی بەژیانی خۆی هێنابوو من بەبێ
هێز مامەوە، چاوە شینەکەی نەما تاکو ئارامی بۆ
ئەو ڕوحە ماندووکەرەم بهێنێت پەپولەکەم
لەباخچەی ماڵم کۆچی کرد، ماڵەکەم بەبێ گوڵ

مایەوە، ئیتر کێ بەزەردەخەنەیەک برینی ئەم ژیانەم بۆ سارێژ بکات؟ ژیانم لەبینایەکی ڕووخاو دەچێت بەهیچ شتێک دروست نابێتەوە هەموو سوچێکی ماڵەکە بۆن و یادگاری ئەوە ئێستاش بەخەیاڵ لەگەڵم دەژێت، هەموو بەیانییەک دوو پیاڵە چای تێدەکەم، چایەکی دوو ڕەنگی کاڵ چونکە دەیگوت بۆ دڵت خراپە چای یەک ڕەنگی تێر، یەک کڵۆ شەکری تێدەکەم لەبەر نەخۆشی شەکرەکەم وەک بڵێیت گوڵ لەلامە ڕەفتار دەکەم ژیانێکی بێ ئەوم قبوڵ نەکردووە تائێستا. دوای پرسەکەی چوومە ژوورەکەی بۆ سەبوری دڵە ماندووەکەم کاغەزێکم دۆزییەوە ئاهـــ خۆزگە نەمبینیایە ڕاستە پرسیاری زۆر لەمێشکم هەبوون ئایا بۆ لەپڕ پەپولەکەم ڕۆشت و دەستی منی بێ گۆچان کرد لەم ژینە پڕ لە زەحمەتە، بۆ باخچەکەمی زەرد و خەزان کرد، چۆن دڵی هات دەستی باوکە ماندووەکەی بەربدات ئەی نەتدەزانی کچی شیرینم بابە لەدوای خودای گەورە هەر تۆی هەبوو، بۆوات کرد نازداری بابە؟.

بەڵام دەستم بەخوێندنەوەی کرد فرمێسکەکانی لەسەری وشک بووبوون دیارە کچە ئازیزەکەم بەگریانەوە ئەم دێرانەی نووسیوە...

**"نامـــەکە".**

بەیانی باش باوکە ئەزیزەکەم کاتێک تۆ ئەم نامەیە دەخوێنیتەوە من لێرە نیم کاتێک ناوم دەهێنیت من وەڵامم نابێت، ئێرە پڕ دەبێت لەخەڵک هەمووان دێن سەبوریت بدەنەوە دەڵێن کچێکی باشت هەبووە بەڵام باوکە هەر ئەو مرۆڤانەی دێنە پرسەکەم دەگرین و خەم دەخۆن هەر ئەوان هۆکاری کۆتایی پێهێنانی ژیانی منن، وشەکانیان بێ هێزیان کردم، لۆمە و قسە ڕەقەکانیان منیان ماندووکرد، باوکە بیرتە ڕۆژێک هاتمەوە جلەکانم هەمووی خۆڵ و پیسی بوون؟ لێت پرسیم بۆوایت ڕۆڵە؟ هیچم نەگوت و تەنها زەردەخەنەیەکم بۆ کردیت و ڕۆشتمە ژوورەکەم، باوکە ئەو ڕۆژە پێنج گورگی پرسی ئەم نیشتیمانە ڕێگایان لێگرتم و داوای پەیوەندیان لێکردم دوای ئەوەی ڕەتم کردەوە پەلاماریان دام و دەستدرێژیان کردە سەرم ئەوەی ویستیان کردیان،

حەزە پیسەکانیان بەمن بەتاڵ کردەوە بۆ ئەوان چێژێکی چەند سانییە بوو بەڵام تەمەن و ژیانی منیان برد بەدەست و گیانی لەرزۆکەوە جلەکانم هەڵگرت و لەبەرم کردن، هاتمەوە بۆماڵەوە لەئاوێنەکە سەیری خۆمم کرد شوێنەواری ئەو گورگە برسیانە لەسەر لاشەم مابوون دەمویست بەچەقۆ گۆشتی گیانم ببڕم تاوەکو لاشەم پاک بکەمەوە لە شوێنەواری ئەو گورگانە، دوای چەند کاتژمێرێک خۆمم شۆرد و ویستم جلەکانیشم بشۆم بەڵام لەگیرفانی چاکەتەکەم زەرفێکم دۆزییەوە بڕە پارەیەکی زۆربوو و لەگەڵ نامەیەک **نووسرابوو:** ئەگەر پێم ڕازی بوویتایە ئەم شتە ڕووی نەدەدا ئەمەش پاداشتی تۆیە بۆ ئەو چێژەی وەرمانگرت.

ویستم لەوکاتەدا کۆتایی بەژیانی خۆم بهێنم بەڵام بیرم کردەوە کێ دەبێتە هاوڕێگایی ئەم ژینە تاڵەت باوکە نەمتوانی دەستەکانت بێ دەستی خۆم بکەم، هەموو شتێکم لەسوچی ئەم دڵە بچووکەدا ناشت، دڵم بووە گۆڕێکی تەنگ لەجیاتی ژیان، هەوڵمدا بەسەرخۆمدا زاڵبم و ئاسایی بم لەبەر دڵی تۆ باوکە، چەند مانگێک ڕۆژەکانم بەوزەیەکی زۆرەوە بەڕێدەکرد برینەکانم کردە قوربانی تۆ باوکە هەمیشە

زەردەخەنە لەسەر لێوانم بـوو بەڵام لەگەڵ تاریکبوونی ئاسمان و ڕۆشتنی خۆر و هاتنی مانگ ژینی منیش وەک ئاسمان تاریک دەبوو، ژوورەکەم دەبوو بەشانۆی ئەو ڕووداوە ناخۆشانە

هەمیشە لەمێشک و دڵمدا بوون و لەپێش چاوم لانەدەچوون، چاوانم بەبێ دەنگی بارانیان دەباراند.

دوای تێپەڕبوونی چەند ڕۆژێک، ڕۆژێک لەکار هاتمەوە بەڵام تێڕوانینی خەڵکی گەڕەک بۆم جیاوازبـوو، وەک ڕۆژانی دیکە دادە فاتم نەیدەگوت: چاو شینەکەم بەخێربێیتەوە، کاک ئازادی لەفە فرۆشی سەری کۆڵانەکەمان نەیدەگوت: وەرە کچم دوو لەفە بۆ خۆت و باوکت ببە. هەمووان لەشوێنی خۆیانەوە لەژێر چاویانەوە سەیریان دەکردم و قسەیان دەکرد ویستم بڕۆم و بڵێم چیبووە؟ بۆ بەوشێوە سەیرە لێم دەڕوانن هیچ ڕوویداوە؟ بەڵام دواتر گوتم وازبێنە ماندووی بڕۆوە ماڵەوە، ڕۆژی دواتر هەمان شت ڕوویدا بەڵام خۆم نەگرت و پرسیارم کرد گوتم چییە دادە خێرە بۆوا لێم دەڕوانن خۆ هیچی خراپم نەکردووە؟ بەقاقایەکەوە گوتی: نەبابە شتی خراپی چی ؟ ئەوە شەرمیش ناکەیت دەپرسیت، نانا شەرم چی دەکات لەلای تۆ خۆ لاشە

فرۆشتن لەلای تۆ ئاساییە و بەشتی خراپ دانانرێت، نەتزانیوە لێرە سۆزانی جێگای نابێتەوە؟.

لەشوێنی خۆم وشک بووم هەزار پرسیار هاتە مێشکم، ئەمانە بۆوا دەڵێن، مەبەستیان چییە، سۆزانی کێیە، مەگەر لەگەڵ منیانە، لاشە فرۆشتنی چی؟.

دواتر بیرم هاتەوە تۆ بڵێیت باسی دەستدرێژییەکەم بکەن، ئەی چۆن زانیویانە؟.

**گوتم**: دادە باسی چی دەکەیت سۆزانی چی؟ خۆتان دەزانن بەسەربەرزییەوە کار دەکەم و نانی خۆم و باوکە پیرەکەم پەیدا دەکەم.

**گوتی**: بەڵێ ئێمەش واماندەزانی وایت و کچێکی بەحەیاو بەشەرمیت بەڵام کۆمەڵێک گەنج گوتیان لەگەڵ تۆ ڕایان بواردووە ڕاستە یان نا؟.

**گوتم**: ئاخر بهێڵن ڕوونیبکەمەوە بەبێ ئەوەی هیچ بزانن بڕیارم لەسەرمەدەن.

هەموویان هاواریان کرد و **گوتیان**: لەشفرۆش لێرە جێگای نابێتەوە ئێرە گەڕەکی خەڵکی بەحەیا و بەشەرمە لەبەر خاتری ڕیشی سپی باوکت

هەفتەیەک مۆڵەتت دەدەین دواتر دەبێت ئێرە چۆڵ بکەن.

**گوتم**: تکایە چیرۆکەکە وەکو ئەوەنییە کە دەیزانن باڕوونی بکەمەوە.

هاواریان کردوو **گوتیان**: چێژیان لێت بینی یان نا وەڵام مەدەوە بەچاوی شۆڕتا دیارە کەکردووتە، داوین پیسی وەک تۆ جێگای لێرە نابێتەوە.

باوکە بۆ کەسێک نەبوو گوێم بۆ بگرێت و بڵێت چیبووە و ڕاستی ڕووداوەکە چییە؟.

بۆ پرسیاریان کردوو گوێگری وەڵامی من نەبوون؟.

بۆ بەمێشکی خۆیان چیرۆکەکەیان نووسییەوە؟.

بۆ تەنها بەمن گوترا سۆزانی ئەی ئەو پێنج گورگە چی؟ ئەوان چین و چیان پێدەگوترێت؟.

بۆ یەکێک عەیبەکانی منی دانەپۆشی؟.

بۆ یەکێک نەبوو برینەکانم سارێژ بکات؟.

ئایا هەڵەی من بوو، من بەئارەزوی خۆم جەستەی خۆمم پێشکەشی ئەو گورگانە کرد، بۆچی تاوانی پێنج کەس بەسەرمنا شکایەوە، ئەی ئەو گورگانە بۆ بەپاکی مانەوە و بێ لۆمەکردن دەسوڕێنەوە؟

باوکە لەکوێدا بووە و ڕوویداوە تاوانی پێنج کەس یەک کەس باجەکەی بدات؟

**مەگەر باوکە مامۆستا فێری نەکردین1+5=6 ئەی بۆ لێرە 1+5=1 بۆ لێرە یاساکان جێبەجێ ناکرێت؟.**

نیشتیمان وەکو دەریایی مردوو لێت پڕم، لەسوچێکی نائومێدییەوە ویستم دەست بەژیان بکەمەوە بەڵام تۆ تروسکایی ڕووناکیت لێداخستم، نیشتیمان بەدڵێکی مردوو و ناخێکی بریندارەوە بۆت پێکەنیم بەڵام وشەی کۆمەڵ...گاکەت منیان لەژیان تۆراند، کۆمەڵ...گاکەت منیان خنکاند، هیوا و هەلێکیان بۆم نەهێڵایەوە، نیشتیمان تۆ ڕوخێنەری من قوربانی دەستی بێ حوکم و یاسای تۆم، دەنا لەکام سوچی ئەم جیهانە یەک کەس باجی قێزەونی پێنج گورگی پرسی کۆڵانەکان دەدات؟نیشتیمان مەگەر من چیم لەتۆ دەویست جگە لەبستێک شوێنی ئارام لەپەنای باوکە نابیستەکەمەوە و گیرفانێکی خاوەن پێنج دیناری حەڵاڵ من چیم ویست و چیم

دەستکەوت؟ بۆیە شەوێکی هێمنی ساماڵ من ئەم نیشتیمانەم جێهێشت و لێی چوومە دەرەوە بۆ هەمیشە.

نیشتیمان تۆ موڵکی گورگ و کۆمەڵ...گاکەتی خەم مەخۆ ئالیکی باشت بۆ خەزن کردوون، ئێستا ئەگەر بەهیوای ژیانەوە باوەشم بۆ بکەیتەوە من هەڵدێم لێت، ئەگەر ببیت بەدەریایی ئومێد من قومێکت لێناخۆمەوە، ئەگەر ببیت بەشوێنی ژیان من بەرەو مەرگ هەنگاو دەنێم، نیشتیمان بۆم بسەلمێنە 1=5+1

**نیشتیمان دەڵێیت دادوەرێکی سەرخۆشیت کوێریت لەئاستی ڕاستییەکان، دەڵێیت شۆفێرێکی خەواڵویت پێنج گورگت تێپەڕاند و منت کردە ئامانج، دەڵێیت کەشتیوانێکی نەزانیت منت لەدەریایی ژیان بەزیندووی نقوم کرد، دەڵێیت مامۆستایەکی نەخوێندەواریت منت لەتاقیکردنەوەی ژیان کەواند، دەڵێیت پاشایەکی ستەمکاریت منت لەدادپەروەری بێبەشکـرد.**

باوکە خۆت دەتزانی هەموو ئاواتی من ئەوەبوو چارەسەری تۆبـکەم و ئامێرێکی بیستنت بۆ بکڕم

بەڵام لەتوانایی گیرفانی مندا نەبوو، دەمویست کاتێک بانگم دەکەی گوڵ گوێت لەوەڵامی گیان بێت، دڵخۆشم باوکە کەتۆ گوێت لەو قسە ڕوخێنەرانەی کۆمەڵ...گا نەبوو باوکە هێزی وشەکان سنووریان نییە شانەکانم توانای هەڵگرتنی ئەو هێزەیان نەبوو، تکات لێدەم بەو پارەیی لەناو زەرفەکەیە چارەسەری خۆتی پێبکە و خانویەک بکڕە و لەو گەڕەکە بڕۆ.

تکایە باوکە وەسێتی کچە قوربانییەکەت جێبەجێ بکە تکایە.

**♦داواکاری گـوڵ: نیشتیمان من لەبازنەی تۆ چوومەدەرەوە بۆ هەمیشە بەڵام کۆمەڵ...گاکەت فێربـکە1+5=6.**

هەروا بەدیارییەوە بەبێ دەنگی دانیشتبووم فرمێسک ڕێگەی پێم نەدەدا هیچ بڵێم، کاغەزی نامەکانی نوشتانەوە و کردیە گیرفانی، **گوتی**: وادەبینی وەسێتی کچەکەم هێناوەتەدی ئێستا دەبیستم بەڵام پاش چی؟ گوێم لەوەڵامی گوڵ نییە گوێم لێی نەبوو کاتێک دەیگوت باوکە، گوێم لەئازار وناڵەی شەوانی

نەبـــوو، گوێم لەوخەنجەرانە نەبوو کەبێ ڕەحمانە لەدڵی کچەکەمیاندا وشەکانیان گوڵی منیان سیس و وشک کرد، گوێم لە لۆمەی ئەم کۆمەڵگا نەفرەتییە نەبوو تاکو پارێزگاری لێبکەم، بەڵام دەزانیت ڕۆڵە تۆش هەمان هەڵەت دووبارە کردەوە؟.

لەمێشکی خۆت واتدانابوو منداڵەکانی من وەفایان نییە بۆیە ئەم پیرە پیاوەیان لێرە بەتەنها جێهێڵاوە بەڵام تۆ پرسیارت کردوو و چاوەڕێی وەڵام بوویت و تاکو کۆتایی گوێت بۆ گرتم بەڵام بەداخەوە کەس نەبوو گوێ لە گوڵەکەی من بگرێت دەی ئاخر خۆ لێشیان نەپرسی چیبووە بەمێشکی خۆیان ڕووداوەکەیان سەپان بەسەر کیژە ناخ جوانەکەی مندا.

بەگریانەوە هەستا و چووە ژوورەوە من هەر لەشوێنی خۆم بەبێ دەنگی دانیشتووم بێ ڕەحمی ئەم

کۆمەڵگایە منی سڕ کردووە بەڵام کاتێک چووە ژوورەوە دەرگاکەی بەجوانی پێوەنەدا ئەوم لێدیارە لەباخچەکە دانیشتووە و ڕۆشت چای هێنا بەڵام دوو کوپ چای وەک بڵێیت گوڵ بوونی هەیە لەوێ، ئێستاش لەگەڵ بۆن و یادەوەرییەکانی گوڵدا ئەم ژینە تاڵە شیرین دەکات.

## کوژرا یان خۆی کوشت؟.

ڕۆژانە گوێمان لەچیرۆک و هەواڵی دووبارەی زۆر دەبێت، فڵان خۆی کوشت، فڵان خۆی سووتاند.

دکتۆرەکە دێتە لات و دەڵێت: بەداخەوە بەپێی پشکنینەکان بێت ڕۆڵەکەت بەهۆی بڕینی شادەمارییەوە خۆی کوشتووە و مردووە.

یان دەڵێت: بەهۆی ئەو پەتەی لەملی خۆی ئاڵاندووە پاڵەپەستۆی دروست کردووە و خنکاوە چونکە هەناسەی لێبڕاوە.

لێرە هۆکاری مردن تەنها فیشەک، بڕینی دەمار، خنکان، سووتان دەبینرێن، ئەی هۆکارەکانی دیکە؟.
ئەی فشار و قسەی خەڵک و ئەو پاڵەپەستۆیەی ناو مێشکی مرۆڤەکان؟.

خۆزگە ئامێرێکیان دروست بکردایە تاکو پاڵەپەستۆی مێشکی دیاری بکردایە ئەوجا دەزانرا ئەم کۆمەڵە مرۆڤە خۆیان نەکوشتووە بەڵکو کوژراون.

مرۆڤەکان چەند بەهێزبن و توانای ڕوبەڕووبوونەوەیان زۆربێت و باوەش بەژیاندا بکەن ڕۆژێک قسەی ناخۆش وفشاری کۆمەڵگا بێهێزی دەکات و پشت لەژیان دەکات و بەرەو مردن هەنگاو دەنێت.

لەمێژە گوتراوە جام کەپڕبوو لێی دەڕژێت

زۆر دەبیستین کە بۆمب وێرانکەرە

فشاریش بۆ مرۆڤ ڕۆڵی بۆمب دەگێڕێت

فشار مرۆڤ دەتەقێنێتەوە، مرۆڤ بێهێز و ماندوو دەکات، دەبێت ڕاستگۆبین لەگەڵ هەستەکانماندا

بۆوا دەکەن؟.

بۆ مرۆڤ وێران دەکەن تاڕادەی تەقینەوە؟.

بۆ مرۆڤ ماندوو دەکەن تاکو ڕادەی وازهێنان؟.

بۆ مرۆڤەکان دەتۆرێنن لەخەونەکانیان بەهۆی قسە ڕەقەکانتانەوە؟.

بۆ مرۆڤ لەبازنەی ژیان دەکەنە دەرەوە بەهۆی گومانە پیس و خراپەکانتانەوە؟.

چەند جار واتان کرد؟.

یەک جار؟.

دوو جار؟.

سێ جار؟.

دواتر دەڵێین: بۆ گۆڕایت، بۆ ساردیت، بۆ وەک جاران نیت، بۆ وازت هێنا و خاڵی کۆتاییت دانا؟.

نا ئەزیزم بەرگە گرتنی ئەوان یەک و دوو جار نەبوو، لە ئاستی خۆی تێپەڕی مەحاڵە مرۆڤێک بتەقێتەوە و ببێتەوە بە مرۆڤەکەی جاران، ڕەنگە شوێنەواری برین بەپێی کات ساڕێژ ببێت بەڵام کاریگەری وشەکان ساڕێژ نابن هەمیشە وەکو برینێکی تازە دەمێنێتەوە، هەمیشە لەدڵ و مێشکدا هاتوچۆ دەکات تاکو دەگاتە ئاستی کۆتایی و خاڵی کۆتایی دادەنێت.

کێ دەڵێت مرۆڤ بەوشەیەک نامرێت؟.

وشەکان موعجیزە دروست دەکەن، **دەکرێت بەوشەکانت مۆمی هیوای کەسێک هەڵبکەیت و بەپێچەوانەوە دەکرێت وشەکانت دەروازەی ئومێد و ژیان لەکەسێک دابخات**، وشە چوار پیتە بەڵام کاریگەری نەسنووری هەیە نەئەندازە، ئەزیزم با وشەکانت هێز و ئارامی بێت، مەڵێ قسە هیچ نییە بەڵکو زۆریشە بۆ مرۆڤێک کە ڕێگای ون کردووە، وشەکانت بکە بەئاوازی جوانی،**وشەکانت باڕۆڵی باران ببینن لەبیابانێکی وشکدا.**

هیچ کاتێک کەمتەرخەمی مەکە لەوشەی جوان و شیرین ئەزیزم مرۆڤەکان زۆر لەوە ماندووترن تاکو تەحەمولی وشەی بێزارکەریان هەبێت با زارمان شیرین بێت و میهرەبان بین، ڕوحی یەکتر لەباوەش بکەین و ببین بە برین پێچ بۆ برینەکانی یەکتر، ئاوازی ژیان بۆ یەکتر بژەنن ئەزیزم قەدری پێکەوە بوونتان بزانن.

**بیرتان بێت خاک شتێک لەباوەش بگرێت نایگەڕێنێتەوە.**

## پــەیامی مـن بۆ تۆ

**ئەم ڕۆژانە سەخت تێدەپەڕن**، دەزانم ماندوویت نازانم هۆکاری ماندووبوونت چییە؟ یان نەبوونی چی شتێک ئەم ڕۆژانەی سەخت کردوویت، گرنگ نییە بارودۆخەکان چۆنن و چۆن تێدەپەڕن، ماندوو مەبە و بەهێز بمێنەوە، ئارامگربــە ساتەکانی تەمەنت هین خودان دەتوانێت بەیانیت بەخێر و ڕوداوی جوانەوە بڕازێنێتەوە، ڕەنگە قسەی چواردەورەکەت بێزارت بکات و دڵە جوانەکەت ماندوو و بێ ئارام بکات، بەڵام خودا ئاگای لەدڵی تۆیە دەزانێت چی دەگوزەرێت لە ناخ و مێشکی تۆدا.

**ئەزیزم تەنها خودا بەس نییە بۆ بەئاگابوون لەنییەتی دڵە جوانەکەت؟.**

گوێ بەقسەکانیان مەدە و بەردەوامبە، شانەکانت قورس مەکە بەهەڵگرتنی باری قسەی خەڵکی.

**هەندێک مرۆڤ هەیە وەکو تیروکەوانێکی بێ ئامانج تەنها تیر دەهاوێژێت، هیچ ئامانجێکی نییە تەنها دەیەوێت تۆ بریندار بـکات.**

ئەزیزم بیرت بێت **خودای گەورە دەفەرموویت:**

**(فلا یحزنــک قولهـم).**

**واتە: باقسەکانیان خەمبارت نەکەن.**

**دەزانم شەوانیشت پڕە لەبیرکردنەوە...**

دڕەنگی شەوە لەژوورەکەت ڕاکشاویت یادەوەرییەکان وەک سووپایەکی بێ بەزەیی دەوریان داویت، چاوەکانت خەریکە تەڕ دەبن بەبیرکردنەوە لەڕابردوو لەو یادەوەریانەی کەتێیدا دڵخۆشبوویت بەچەند ساتێکی خەیاڵ پرچە ڕەشەکانت سپی دەبن، تەمەنی هەرزەکاریت دەبێتە پیری، بزەی لێوانت لێت دەتۆرێن.

ئەم شەوە درێژانە ئاوا تێناپەڕن.

**نازانم چیت بۆ بنووسم و کامە برینت سارێژ بکەم بەڵام دەڵێم پێبکەنە هههههـ ژیان جوانە یان جوان دەبێت.**

ڕۆژێک ئەو سووپایە تێکدەشکێنیت، چاوەکانت بە ئاسوودەیی لێک دەنێیت و دەخەویت، پرچە ڕەشەکانت شانە دەکەیت و بزەی لێوت دێت لە پێکەنین، دەرگایی ڕابردوو دادەخەیت و بەرەو داهاتوو هەنگاو دەنێیت

دەڵێم ئەزیزم با ئەو ڕۆژە ئەم شەو بێت و ئەو ژاوە ژاوەی مێشکت بوەستێنە.

**تەمەن وادەڕوات ئەزیزم مەگەر دەکرێت چەند شەوی دیکەت ئاوا تێپەڕێنیت؟.**